نازم حیکمەت

# داستانی شێخ بەدرەدین

## کوڕی قازیی سیماونە

گۆڕینی:

شوکور مستەفا

ناوی کتێب: داستانی شێخ بەدرەدین کوڕی قازیی سیماونە
نووسینی: نازم حیکمەت
گۆڕینی: شوکور مستەفا
بڵاوکراوەی ئاراس– ژمارە: ٩٧٢
دەرهێنانی هونەریی ناوەوە: ئاراس ئەکرەم
بەرگ: مەریەم موتەقییان
چاپی دووەم: هەولێر، ٢٠١٠
لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان لە هەولێر ژمارە ٢١٧ی
سالّی ٢٠١٠ی دراوەتێ

# نازم حیکمەت
# شاعیری گەورەی چەرخەکان

یەشار کەمال

من بزانم لە پێشدا لە داستانەکەی شێخ بەدرەدینی کوڕی قازیی سیماڤنارڕا تێ هەڵچوو. ئیلیادە و ئۆدێسـاش کە بەشاکارترین داستانی دنیا لە قەڵەم دەدرێ هەر لەو خاکەدا لەدایک بووە و پێڕۆکە بووە و نێوبانگی دەرکردووە و ژیاوە. هەندێ پارچەی ئیلیادە و ئۆدێسا تا ئێستاش بەسەر زاری خەڵکەوەن و دەیڵێن و دەیڵێنەوە.

چیرۆکەکانی (خاڵە قۆرقوت) چەند بەشێکن لە داستانێکی گەورە کە تا ئێستا ماونەتەوە. کوێر ئۆغڵۆش هەر لەو بابەتەیە. لە ڕۆژهەڵاتی ئەنەدۆڵێ، لە باشووریی، تا ئەورۆش داستان هەر دەگوترێ. ئەوەش وەنەبێ یەک دوو، کۆمەڵێ داستان بەسەر زارانەوە دەگەڕێ.

سەرزەمینی ئەنەدۆڵ سەرزەمینی داستانی دنیایە. سەرزەمینێکی دەوڵەمەند، سەر بەگۆبەند و خاوەن کەسیەتیی خۆیەتی، نابێ داستان، بەو پێودانە تەسکەی مێژوونووسانی ئەدەب دەڵێن: بپێورێ. هەڵەیە. داستان لە هەموو چەرخێکدا هەیە و دەشبێ. داستان چاخی بۆ نییە. لە هەر چەرخێکدا، لە هەر خاک و مەڵبەندێکدا کارەسات و هەراوهۆریای گەورە و بەرفرەوان بقەومێ داستانیش لەوێ سەر هەڵدەدا. جا نازم حیکمەتیش گەورەترین ئاڵقەی نەریتی داستانبێژی ئەنەدۆڵە لە چەرخی ئەورۆماندا.

گوتم نازم حیکمەت لە شێخ بەدرەدینەوە تێ هەڵچوو. نازم حیکمەت هەرکە پێوەندیی لەگەڵ ئەنەدۆڵدا ڕۆنا و ڕۆنەنا، ناچار لە شیعریشدا پێوەندیی لەگەڵ

داستانبێژیداڕۆنا. شاعیرێکی جیهانی لە کێشی نازم حیکمەت ناچار بوو بە ئاکامی گەورەی خۆی بگا. جا بەڕاستی واشی کرد و گەیشتیش. لە نەریتی گەورەی خۆیدا بەرهەمێکی، کە بۆ یەکەم جاری سوود لێ وەرگرت داستانی شێخ بەدرەدین بوو. لە شێخ بەدرەدیندا یەکسەر لە شیعرەکانی پێشووی هەڵدەبڕێ و ئەو داستانە بەرەو لووتکە و ترۆپکی شاعیرێکی گەورەی هەڵدەکشێنێ. داستانی شێخ بەدرەدین، بە زمانەوە، بە بنیادەوە، بە دامەزراندنەوە داستانێکی پێکەڵ و کۆک و تەواوە و کەرەستە خۆشەکردن و خۆئامادە و تەیارکردنێکە بۆ داستانەکەی دواییێ. (چەند دیمەنێکی ئینسانانی وڵاتی من) داستانی ئەو چەرخەی ئەوڕۆیە.

ئەو داستانە ئینسانانی تورکیا و هەموو دنیای هاتووەتە نێو. لەو داستانە گەورەیەدا لەگەڵ خەڵکی هەژاری لادێیی ئەو چەرخە، لەگەڵ سەربازان، لەگەڵ چەوساوان، لەگەڵ چەوسێنەراندا دەژین. زمانی ئەو داستانە ئەو زمانەیە کە یونس و قەرەج ئۆغلۆ و دادڵ ئۆغلۆ و پیر سوڵتان عەبداڵ و خەڵک پێی داخێون. زمانی داستانەکە وەکو خەڵک پێی دەدوێن ڕەوان و بێ گرفت نووسراوەتەوە. زمانی ڕۆژانەی خەڵکە. جا زمانی هەموو داستانەکانی دنیاش هەر بەو زمانە گوتراون، کە خەڵکی ڕەمەکی، ڕۆژانە، قسەی پێ دەکەن. ئەمە لە داستانی ماناسیشدا هەر وایە، لە داستانی ئیلیادە و ئۆدێساشدا هەر بەو ڕەنگەیە. لە داستانی مەم و زینیشدا هەر وایە. ئەوانە پێیان وایە داستان زمانێکی تایبەتیی خۆی هەیە بەهەڵە دەچن.

نازم حیکمەت چاک بۆ داستان چووە، زۆری لەسەر داستان کار کردووە، دەستی لەسەر ئێش و ئازاری هەموو لایەکی داستان داناوە و شاگردیی هەموو داستانبێژانی کردووە و پڕ بەپێستی نەریت و لێهاتووی خۆشی وەکو مامۆستا داستانبێژە گەورەکانی گەیشتووەتە ترۆپکی داستانبێژی. ژیانی داستانبێژ لە نێو ژیانی کۆمەڵانی خەڵکدایە. داستانەکە لەنێو جەرگەی ژیانی خەڵکدا ڕۆ دەنێ. ژیانی نازم حیکمەتیش بەو ڕەنگە بوو.

ڕۆژێکیان بە نازم حیکمەتم گوت:

«ئەگەر زیندان نەبووایە، ئەم داستانە گەورەیە دەبوو؟»

گوتی:

«لەوانە بوو شتێکی دیکە بووایە، بەڵام داستان نەدەبوو. ئەو داستانەمان لە زیندان هەموو پێکەوە نووسی. من لەوانم دەپرسی و ئەوان وەڵامیان دەدامەوە. هەرچییەکم دەنووسی بۆم دەخوێندنەوە. ئەو داستانە بەو جۆرە نووسرایەوە».

خۆ ئەوانەی خەریکی ئەدەبیاتن دەزانن داستان بەو ڕەنگە لەدایک دەبێ. داستان خەڵک لەگەڵ هونەرمەندەکانیدا پێکەوە دەیهۆننەوە.

منیش گوتم:

«ئەگەر زیندانیش نەبووایە، تۆ ڕێگای ئەوەت دەدۆزییەوە کە بەو خەڵکە بگەی و ئەم داستانە دابڕێژی».

پیاوێکی زۆر بێ هەوا بوو. وەڵامی ئەو قسەی نەدامەوە. پاش چەند ڕۆژێک، جا یا بیری لێ کردبووەوە، یا لە بابەتێکی دیکەوە لەلارا وەبیری هاتبووەوە، گوتی:

«ئەگەر ژیانم لە زیندان نەبردبا سەر من وا نەدەبووم، لەوانە بوو شاعیرێکی چاترم لێ هاتبا بەرهەم».

من سەرسام بووم. پیاوێکی وەکو نازم بڵێ شاعیرێکی چاترم لێ هاتبا بەرهەم. لە یونس بەملاوە گەورەترین شاعیری میللەتێک، یەکێ لە هەرە ترۆپکی شاعیرانی چەرخەکان...

بۆرجوازی، بۆرجوازی نییە، گەورەترین شاعیری میللەتی تورکی سەرکوت کرد، دەربەدەری کرد. ناچاری کرد لە وڵاتی بیابانیدا بە نامرادی سەر بنێتەوە. ئەم چینە بۆچی ئەوەندە دوژمنی نازم بوو؟ هەر بۆ تاوانبارکردنی ئەم هەموو مەحکەمە و مەحکەمەکارییە ساختانەی بۆچی پێ دەکرد؟ چونکە ئەم چینە دوژمنی زانا و نەزانی میللەتی تورکە. دوژمنایەتیی گەورەترین شاعیری میللەتێک واتە دوژمنایەتیی سامانی ئەو میللەتە و خۆیەتی.

ئەو دزێوی و خراپەیەی دوژمنانی میللەت لەگەڵ نازم حیکمەتدا کردوویانە

تا دنیا ماوە پەڵەیەکی ڕەش و چڵکنە بە ڕووی مێژوومانەوە.

تا میللەتی تورک لەسەر دنیا بمێنێ ئەو داستانە گەورەیەی نازم حیکمەت لە گوێ ئاگردانان دەخوێنێتەوە و بەرەو نەوەکانی میللەتی تورک پشتاوپشت تووک نفرین لەو دوژمنانە دەکەن کە ئەو خراپە ناپیاوانەیان لەگەڵ نازم حیکمەتدا کرد.

زیندووبوونەوەی مەحکەمەکەی نازم حیکمەت، پاکانەی نازم حیکمەت ڕۆژێ دێ ببێ بە تاوانبارکردنی ئەوانەی کە بەو دەردەیان برد و دادی تورکیان لەو تۆمەتە گەورە و گرانە، لە تۆمەتی دەست لەگەڵ بورجواز تێکەڵکردندا ڕزگار بکا. دەنا، تا میللەتی تورک بمێنێ، هیچ کەسێ، لە هیچ کاتێکدا، لە هیچ چەرخێکدا هێزی بەوەدا ناشکێ نازم حیکمەت تاوانبار بکا.

بەیان ژمارە ٣٥ نیسانی ساڵی ١٩٧٦ی زاینی

نامیلکەی «بەدرەدینی[1] کوڕیی قازی سیماونە» – ناوی، محەمەد شەرەفەدین

(١) شـێخ بەدرەدین – کـە مـێـژووی لەدایکبـوونـی بە تەواوی یەکـلا نەبووەتـەوە (بە مـەزەنە لـە ١٣٤٤دا لەدایک بووە) و لـە ١٤٢٠دا مـردووە، فـەیلـەسـووف و مـەلای تورکانە. سـەبارەت بەوە، کە بەمـەزەنە، لە شارۆکەی (سـیمـاو)ی سەر بە ناوچەی کـوتاهییـە لەدایک بووە، بەنازناوی بەدرەدینی سـیـمـاوی ناوبانـگی ڕۆیشـتـووە. قازیی سیماونە، کوڕی ئیسرائیلە.
شێخ بەدرەدین دەیگوت مرۆی هەموو سـەر زەوی بەبێ ڕەچاوکردنی پێڕۆ و ئاین، دەبێ هـەموو یەکسان و بەرابەر بن و لە سـەرتۆپی دارایی و زەویوزار و بەرهـەم و داهاتدا دەبێ هاوبەش و یەک ماڵ و یەک کیسـە بن، هێندێ شت کـە هـەر لەخۆڕا حـەرام کراون دەبێ حـەڵاڵ کرێنەوە. ئەم بیـر و بڕوایە لە ناو خـەڵکدا بە بەربڵاوی تەشـەنەی کـرد و خـەڵک زۆری بە پەرۆش و هەڵوەدا بوون و شـێـخ بەدرەدین بەمـە بوو بە پێشـەوای یەکەم بزاوتی گەورەی شـۆڕشـی کـۆمـەڵایەتی لە مێژووی تورکی عوسمانلیدا. =

ئەفەندیم دەخوێندەوە، کە لە کولیيەی ئیلاهییات، لە دارولفونوون مامۆستای مێژووی کەلام[٢] بووە.

ناميلكەكە لە ساڵی ١٩٢٥ (١٣٤١)دا لە چاپخانەی ئەوقافی ئیسلامییە لە چاپ دراوە. گەیشتبوومە لاپەڕە شەست و پێنجی ناميلكەكە، دوكاس، مێژوونووس و میرزای جەنەوەییەکان[٣] لەم لاپەڕە شەست و پێنجەی ناميلكەكەی مامۆستای مێژووی کەلامدا گوتوویە:

«لەو سەردەمانەدا، لە وڵاتێکی بە کەژ و چیای سەختی لای دەربەندی کەنداوی یۆنیۆن، کە خەڵکی سادە و ڕەمەکیی «ستیلاریۆم - قەرە بوروون»[٤] (کەپوە ڕەش)ی پێ دەڵێن، گوندییەکی تورکی ساویلکەی خواسایی پەیدا بوو.

---

= شێخ بەدرەدین دەیگوت، ئەم دنیا و ئەو دنیا، دنیای ڕۆح و دنیای مادە، هەردووکیان شان بەشانی یەک چوونیەک و نەمرن و نالوێ بەبێ ئەمیان بیر لەوی تریان بکرێتەوە. بەمەش بوو بە یەکەم فەیلەسووفی ماتریالیستی تورکان.

نازم حیکمەت، بەنیازی لە دنیا ڕاگەیاندنی ناوبانگی ئەم فەیلەسووفە گەورەیەی نەتەوەکەی، ڕووداوە لەمێژینەکەی بەم داستانە بەئاووتاوە هەڵبەستووە.

نازم حیکمەت نەتەوەکەی خۆی زۆر خۆش ویستووە. تەنانەت کە ئەم داستانە لە ١٩٣٦دا بڵاو دەبێتەوە، هەندێ لە سەرپەڕانی بیر و بڕوا تیژی دەستەچەپ لێی لالووت دەبن و دەیانەوێ شانازی بە نەتەوەوەکردنی لێ بە عەیبە بگرن. ئەویش نایکاتە نامەردی، بە وتارێکی زانستانە وەڵامیان دەداتەوە و پێیان دەسەلمێنێ، کە شانازی بە نەتەوەوەکردن لەگەڵ برایەتیی نێو گەلاندا ناکۆک نییە و دوو شتی دژ بەیەک نین.

(٢) کەلام: عیلمی کەلام، یەکێکە لە زانستە فەلسەفییەکانی ئاینی ئیسلام و بۆ داکۆکی لێکردنی بنچینەکانی ئەم ئاینە دانراوە.

(٣) نیسبەتە بۆ شاری جەنەوە (بندقیة) لە ئیتاڵیا.

(٤) قەرە بوروون: شارۆلکەیەکە سەر بە ویلایەتی ئیزمیر، لەسەر دەریای ئەگە (ئیجە) هەڵکەوتووە.

ستیلاریۆم بەرانبەر بە دوورگەی ساقزە[٥]. ئەم گوندییە پەند و ئامۆژگاریی بۆ تورکان دادەدا: جگە لە ژن، سەرلەبەری دارایی، لە خۆراک، لە پۆشاک و لە زەویوزار بکەن بە ماڵی هەمەلایەنی و گشت تێدا هاوبەش بن».

میرزای جەنەوەییەکان ڕێنموونی و ئامۆژگاریی ئەو گوندییە تورکە خواسایییەی هێند بە ڕوون و ئاشکرا باس کردووە کابرام بە بەرگە قەدیفە ڕەشەکەی و ڕدێنە باریکەکەی و دەموچاوە زەردە درێژووکەکەیەوە زەق و زۆپ هاتە پێش چاو. کە مریدی هەرە گەورەی بەدرەدینی کوڕی قازیی سیماوەنەی بە ساویلکە و خواسایی بە هەردوو واتاکەیەوە نێو هێناوە، بەپێکەنینی هێنام. لە پاشان یەکسەر محەمەد شەرەفەدین ئەفەندیم بەبیر هاتەوە. لە نامیلکەکەیدا، کە لەبارەی مەبەست و نیازی بەدرەدینەوە دەدوێ، دەڵێ:

«بوێر کلیجە، کە ئامۆژگاریی خەڵکی دەکرد: سەرلەبەری دارایی و ئاژەڵ و زەویوزار، جگە لە ژن، بە ماڵی ناوکۆی بزانن، ئەمە بەلای ئێمەوە نیاز شاردنەوەیە و بەرانبەر بە ڕای گشت خۆ لە مەبەست نەبانکردنە».

ئەم مامۆستای مێژووی کەلامەم، لە ڕمڵ هاوێشتن و بەخت خوێندنەوەی چەرخەکان و ڕاز و نیاز هەڵێنانی دڵ و دەروونی ئینسانانەدا بە خاوەن دەستێکی باڵا هاتە پێش چاو و دوو ڕستەم لە نووسینەکانی مارکس و ئینگلس بەبیر هاتنەوە:

«بۆرجوازی ژنەکەی بە ئامێرێکی وەبەرهەمهێنان دەزانێ. بۆرجوازی هەرکە دەبیێ ئامێرەکانی وەبەرهەمهێنان دەبێ هیی هەموولایەک بن و سەرلەبەری خەڵکی تێدا هاوبەش بن، بە سرشت یەکسەر بەو ئاکامە دەگا، کە ژنیش دەبێ وابێ».

کە بۆرجوازییەک بەوجۆرە بیر لە سۆسیالیزمی نوێی کرێکاران بکاتەوە، ئەی مامۆستای کولییەی دارولفونوون بۆچی بەوجۆرە بیر لە سۆسیالیزمی

---

(٥) دوورگەی ساقز: دوورگەیەکە لە دەریای ئەگە. لە کەنار دەریاکانی تورکەوە نزیکە. ئەمڕۆ سەر بە وڵاتی یۆنانستانە.

بەدرەدین نەکاتەوە، کە بۆ وەرزێرانی چەرخەکانی ناوەندی دانا؟ ئەی ژنیش لە نیگای لاهووتەوە بەکەلوپەل دانەندراوە؟

نامیلکەکەم پێوە دا. چاوم دەچووزایەوە، بەڵام خەوم نەدەهات. سەیرێکی سەعاتە مارکە شەمەندەفەرە، بەدیوارا هەڵواسراوەکەم کرد، بۆ دوو دەچوو. جگەرەیەکم کێشا، یەکێکی دیکەی بەدوودا. لە قاوشەکەوە گوێم بۆ دەنگێ هەڵخستبوو وەک بەسەر گەنکاوێکی گەرم و بۆگەندا بێ بەو ڕەنگە دەهات و دەچوو. جگە لە خۆم، قاوشەکە بە بیست و هەشت ئینسان و چەمەنتۆ ئارەقاوییەکەوە نووستبوو. پاسەوانی سەر برجەکان ئەمشەو خێرا خێرا و توندوتیژتر لە فیتوویان دەدا، هەرکە فیت و هۆڕی ئەم فیتوانەم، ڕەنگە لە هیچەش، وا شێتانە و بێ بڕانەوە بەرگوێ دەکەوێ، وا دەزانم لە کەشتییەکدام، لە شەوێکی ئەنگوست لەچاودا نوقم بووە.

لە قاوشەکەی سەروومانەوە زرەی کۆت و زنجیری ئەو یاخییانە دەهات، کە حوکمی خنکاندنیان درابوو. ئەوراقیان لە تەمیز بوو. ئێوارەیەکی بە تۆف و باوبۆران حوکم دران. لەوەتی گەڕابوونەوە سرەوتیان بەجارێ لەبەر بڕابوو. تا بەیانی زرەی کۆت و زنجیرەکانیان دەهات و بەدەوری خۆیاندا دەخولانەوە، کە بە ڕۆژ دەریان دەهێنایە مەیدانەکەی پشتەوە، زۆرجار سەیری پەنجەرەکانیانم دەکرد. سێ مرۆ، دووانیان لە پەنجەرەکەی دەستە ڕاستدا و یەکێکیشیان لە پەنجەرەکەی دەستە چەپدا دانیشتبوون. ئەوی بە تەنیا دانیشتبوو، ئەوەیان بوو، کە گرتبوویان یەکسەر ڕاستیی لە هاوڕێکانی گوتبوو، بەدەستییەوە دابوون. ئەو لە هەموویان جگەرەی پتر دەکێشا.

هەمیشە دەستیان بە شیشی پەنجەرەکانەوە بوو. لە شوێنەکەی خۆیانەوە زۆر چاک دەیانتوانی بڕواننە دەریا و کەژ و کێوان، کەچی هەمیشە تەماشای مەیدانەکەی خوارێ، تەماشای ئێمە، تەماشای ئینسانەکانیان دەکرد.

هیچ گوێم لە دەنگیان نەبوو. لە سەرانسەری بەندیخانەکەدا هەر ئەوان قەت جارێکیان گۆرانی نەگوت. هاتبا زنجیرەکانیان، کە بەدرێژاییی شەوگار هەر ئەوان قسەیان دەکرد، لە تاریک و لێڵەدا دەنگیان بڕابا، سەرلەبەری

بەندیخانە پێی دەزانی، کە سێ کراس سپیی سینگ بە یافتەی درێژ لە قەرەباڵغترین مەیدانی شاردا شۆڕ بوونەتەوە.

ئەسپرینێک لە کوێ پەیدا بکەم کوڕینە، نێولەپم بەجارێ گڕی گرتووە. بەدرەدین و مستەفا بوێرکلیجە لە مێشکمدا هەروا دێن و دەچن. کەمێکی دیکە بتوانم زۆر لە خۆم بکەم و سەرم لەبەر ئێش و ئازار بەجارێ بیناییم لێڵ نەکا، لە نێو ڕینگەی شیر و حیلەی ئەسپ و شریخەی قامچی و هاوار و زریکەی ژن و منداڵی سالآنی زۆر دوورەوە دەموچاوی بەدرەدین و مستەفا، وەک دوو قسەی ورشەدار و بە تیشکی موژدە و ئاوات، دەتوانم ببینم. یەکسەر نامیلکەکەی، کە کەمێ لەمەوپێش لەسەر چیمەنتۆکەم دانابوو، بەرچاوم کەوت. بەرگێکی پێوە بوو، هەر دەتگوت دەنکە گێلاسێکی سیس هەڵاتووە و نیوەی لە بەرهەتاو ڕەنگی پەڕیوە و کاڵ بووەتەوە. ناوی نامیلکەکە بە خەتێکی سولسی سەروبۆرداری زۆر جوان لە پشتی بەرگەکەی وەکو توغرایەک نووسراوە. لێوارە شڕ و دڕاوەکانی لاپەڕە زەرد هەڵگەڕاوەکانی لە دوو تۆیی بەرگی نامیلکەکە دەرهاتوون. گوتم: «پێویستە بەدرەدینەکەم لەم خەتی سولس و قەڵەمی قامیش و دوێت و سووتووی مامۆستای کولییەی ئیلاهییاتە ڕزگار بکەم».

بیرم کردەوە، سەبارەت بە زۆر خوێندنەوە چەندین دێرم لە عەرەبشاوە، لە عاشق و پاشازادەوە، لە نەشرییەوە، لە ئیدریسی بیتلیسییەوە، لە دوکاسەوە، تەنانەت لە شەرەفەدین ئەفەندییەوە لەبەرە:

«لەدایکبوونی شێخ بەدرەدین لە دەوروبەری ٧٧٠ی ز.دا بەهێزەوە مەزەنە دەکرێ».

«شێخ بەدرەدین خوێندنی لە میسر تەواو کردووە و لەوێ ماوەتەوە و هەر لەم وڵاتەدا بووە بە زانایەکی گەورە و خاوەن ناو و شۆرەتی دەرکردووە».

«کە لە میسرەوە بۆ ئەدرنە[٦] گەڕایەوە، هێشتا دایک و باوکی مابوون».

---

(٦) ئەدرنە: ویلایەتێکە لە نزیک سنووری بولغارستان و یۆنانستانەوە هەڵکەوتووە. سەر بە تورکیایە. لە پێشدا پێتەختی عوسمانلییان بووە.

«هەروەکو هاتنی بۆ ئێرە ڕەنگە بۆ دیدەنیی دایک و باوکی بووبێ، هەروەهاش ڕەنگە بەبۆنەی خولککردنی مووسا چەلەبییەوە بووبێ، کە ئەو سەردەمە سوڵتان بوو».

«کاتێ سوڵتان محەمەد چەلەبی[٧] بەسەر براکانیدا زاڵ بوو و بوو بە حوکمڕانیان، شێخ بەدرەدینی لە ئیزنیک[٨] بە دەسبەسەری هێشتەوە».

«شێخ، کە لێرە لە نووسینی «تەسهیل»[٩] دەبێتەوە، لە بەراییەکەیدا، گوتوویە ئاگری نێودڵ و دەروونم گڕگڕ هەڵدەگرێ و ڕۆژ لە دوای ڕۆژ بەجۆرێ تەشەنەی کردووە، دڵم لە ئاسنیش بێ دەتوێتەوە...».

«کاتێکی شێخیان لە ئیزنیک دەسبەسەر کرد، مستەفا بوێرکلیجەی کەتخودای گەیشتە هەرێمی ئایدن[١٠]. ئینجا لەوێوە چوو بۆ قەرە بوروون».

«دەیگوت، هەروەکو من دەتوانم دەست لە ماڵ و دارایی تۆ وەردەم، تۆش دەتوانی دەست لە ماڵ و دارایی من وەردەی. لە پاش ئەوەی خەڵکی ڕەمەکیی گوندییانی بەم جۆرە قسانە بەلای خۆیدا ڕاکێشا، هەوڵی دا دۆستایەتی لەگەڵ فەلانیشدا دامەزرێنێ. سیسمان[١١]، کە لە سەردەمی سوڵتان محەمەد چەلەبیدا والیی سارۆخان[١٢] بوو زۆری هەوڵ دا ئەم ڕەبەنە ساختەیە لەناو

(٧) سوڵتان محەمەدی چەلەبی: پێنجەم سوڵتانی عوسمانییە. کوڕی بایەزیدە لە ١٤١٣وە بەسەر وڵاتدا ڕاگەیشتووە. هەرسێ براکەی خۆی کوشتوون و تەختی فەرمانڕەواییی لێ داگیر کردوون.

(٨) ئیزنیک: قەزایەکە سەر بە ویلایەتی بۆرسە. شارۆکەکەی نزیک دەریای مەرمەڕەیە. لە بەشی ڕۆژهەڵاتی زریچەیەکدا هەڵکەوتووە و هەر بە ناوی ئەویشەوە ناونراوە.

(٩) تەسهیل: ناوی کتێبە شەرعەکەی شێخ بەدرەدینە.

(١٠) ئایدن: ویلایەتێکە نزیک بە ئەنادۆڵ. شارێکی لەمێژنییەیە و بە ڕەگ و ڕیشە دەچێتەوە سەر هیتییەکان.

(١١) سیسمان: کوڕی قڕاڵی سربستان بوو، موسڵمان بووبوو.

(١٢) سارۆخان: ناوە کۆنەکەی (مانیسا)یە.

ببــا، بەڵام نەیتــوانی لە گــەلی و تەگناکــانی ســتــیــلاریۆمــەوە تێ پەڕێ و سەرنەکەوت».

«کوڕی قازیی سیماونە هەرکە بیستییەوە بوێرکلیجە بەرەو سەرکەوتن دەڕوا، ئەویش لە ئیزنیکەوە هەڵات. گەیشتە ئیسفەندیار. لە ئیسفەندیارەوە سواری کەشتییەک بوو، خۆی گەیاندە هەرێمی ئەفلاق. لەوێوە خۆی بە لێڕەواری ئاغاج دەنیزدا کرد...».

«لەودەمەدا جێگری نێوبراو دمگوێ یاخیبوون و شۆفاری و خوانەناسیی بەرگوێی سوڵتان محەمەد کەوتەوە. دەسبەجێ بەناوی شازادە سوڵتان موراد پاتشای ڕۆمی بچووک و(١٣) ئاماسیە فەرمان دەرچوو، کە لەشکری ئەنەدۆڵ کۆ بکرێتەوە و لە دژ مستەفای خوانەناس ڕاسێ و بەئەسپابی تەیار و کۆکەوە لە ئایدن بەسەریدا بدرێ».

«مستەفا بە دە هەزار مریدی شۆفار و خوانەناسەوە لە دژ شازادە ڕاسیا. شەڕێکی گەرم ڕووی دا».

«لە پاش خوێنڕشتنێکی زۆر پشت بە خوا لەشکری خوانەناس بەزی»

«ئەوی بە ساغی مایەوە هێنایانە ئایاسلغ. بە ئازار و ئەشکەنجە و بەوپەڕی دڵڕەقییەوە مستەفایان ئازار دا، بەڵام لە بیروباوەڕی چەسپی خۆی پەژیوان نەبووەوە و لە ئۆلی خۆی هەڵنەگەڕایەوە. چوارمێخەیان کێشا و لەسەر پشتی وشترێکیان دابەست. پاش ئەوەی هەردوو باسکیان بە تەختەیەکدا داکوتا بە هەرا و زەنا بەنێو کووچە و کۆڵانی شاریاندا گێڕا. مریدە ڕاستگۆیەکانیشی لە پێش چاوی لەتوپەت کران. ئەمانە بە هاواری: (بابا سوڵتان مەدەد)ەوە بەوپەڕی دڵنیاییەوە بەپیری مەرگەوە دەچوون».

«لە پاشان بوێرکلیجەیان لەتوپەت کرد و کون کەلێنی دە ویلایەتیان پشکنی. ئەوانەی لەناویان بردن لەناویان بردن، ئەوانەی خەڵاتیان کردن

---

(١٣) ڕۆمی بچووک: ئاسیای بچووک.

خەڵاتیان کردن. بایزید پاشا دووبارە گەڕایەوە بۆ مانیسا[١٤] تۆرلاق کەمالی لەوێ دۆزییەوە. ئەویشی لەوێ هەڵواسی...».

«لەو دەمەدا بەدرەدین لە ئاغاج دەنیز باری لەبار بوو و کاری ڕوو لە هەوراز بوو. لە هەموو لایەکەوە خەڵکێکی زۆری لە دەور خڕ بووبووەوە. هێشتا هەناسەی ئەوەی تێدا مابوو، کە سەرلەبەری خەڵکی لەگەڵدا ڕێک کەوێ، سەبارەت بەمە وا پێویست بوو، کە سوڵتان محەمەد خۆی تێ هەڵچێ».

«هەندێ کەس بە فەرمانی بایزید پاشا خۆیان ترنجاندە نێو کۆڕی قازی بەدرەدین و بە دەک و دەهۆ لە نێو لێڕەوارێکدا گرتیان و باڵبەستیان کرد...».

«بۆ سوڵتان محەمەدیان هێنا لە سەرەز. دانشمەندێک تازە لە عەجەمستانەوە هاتبوو، لە خزمەتی سوڵتاندا بوو، مەولانا حەیدەریان پێ دەگوت. مەولانا حەیدەر گوتی: ئەمە بە شەرع کوشتنی حەڵاڵە، بەڵام ماڵی حەرامە».

«لە پاشان کوڕی قازیی سیماونەیان بەرەو بازاڕ وەپێش دا و لە بەردووکانێکدا هەڵیان واسی. لە پاش چەند ڕۆژێ چەند مریدێکی لەش پیش هاتن بردیان. تا ئەمڕۆش لەو وڵاتە مریدی هەن».

هەر وەخت بوو سەرم بتەقێ، سەیری سەعاتم کرد، وەستابوو. زڕەی کۆت و زنجیری ئەوانەی سەرەوە کەمێ کڕ بووەوە. تەنیا هەر یەکێکیان دەهات و دەچوو. دیارە هەر ئەوەیان بوو کە بەتەنیا لە پەنجەرەکەدا دادەنیشێ.

هەر لە خۆمەوە حەزم لە گۆرانییەکی ئەنەدۆڵییانەیە. پێم وایە ئەگەر دیسان ئەو گۆرانییە کوێستانییە لە قاوشی جەردەکانەوە دەست پێ بکا سەرم دەرەوێتەوە.

جگەرەیەکی دیکەشم پێ کرد. دانەویمەوە. نامیلکەکەی محەمەد شەرەفەدین ئەفەندیم لەسەر چەمەنتۆکە هەڵگرتەوە.

لە دوورەوە باهۆزی دەهات. بن پەنجەرەکەمان دەریایە، نرکەی باهۆز، زڕەی

---

(١٤) مانیسا: پارێزگایەکە لەسەر ناوچەی ئەگە هەڵکەوتووە، نزیک بە ئەنەدۆڵ.

کۆت و زنجیری کپ و بێدەنگ کردبوو.

بن پەنجـەرەکـەمـان خـەریکە دەبێ بە کـەمـەرکـاج. چەند جـارمـان ویست سەیری ئـەو شوێنە بکەین، کە دەریا و دیوارەکانی لێ بەیەک دەگەیشتن، بەڵام نەدەکرا. پەنجـەرەکـە نێـوان شـیـشـەکـانی زۆر تەسک بـوون، سـەریان پێـوە نەدەچوو، دەریامان هەروەک ئاسۆ دەهاتە پێش چاو.

جێگاکەی شەفیقی تۆڕنەچی بەتەنیشت جێگاکەی منەوە بوو. شەفیق بەدەم خـەوەوە هەندێ ورێنەی کـرد و بەم دیوا وەرگـەڕا. لێـفـەی زاواییـیـەکەی، کـە ژنەکـەی بـۆی ناردبوو، لەسـەر خـۆی لادا. دام پۆشـیـیـەوە. لاپەڕە شـەست و پێنجی نامیلکەکەی مامۆستای مێژووی کەلامم دیسان کردەوە. هەرکە چەند دێرێکم لە قسـەکانی میرزای جەنەوەییـیەکان خـوێندەوە، لە پڕێکدا بەو ئێش و ئازارەی سەرمەوە دەنگێکم بەرگوێ کەوت. دەنگەکە دەیگوت:

– بە ئەسپایی و بێدەنگ بەسەر شەپۆلی دەریاوە دێم بۆ کنت.

ئاوڕم دایەوە. تەمـاشـا دەکـەم یەکێ لە پشت پەنجـەرەکـەی سـەر دەریاوە وەستاوە. تومەز ئەوە، قسەی دەکرد، گوتی:

«نووسینەکانی دوکاس، میرزای جەنەوەییەکانت لە بیر چووەوە؟

ئەی ئەوەت لە بیر نەماوە کە باسی قەشـەیەکی گریتیی کـەنیشتی تورلووت ناوی دوورگەی ساقزی دەکرد؟

من یەکێ لە (مرید)ەکانی مستەفا بوێرکلیجەم. تۆ بڵێی منیش نەتوانم وەک ئەو قەشە گریتییە بە سـەری ڕووت و پێی پەتی و عابایەکی سپیی یەکپارچەی بێ تەقەڵەوە بەسەر شەپۆلی دەریاوە بگەمە لات؟»

لەبەرئـەوەی، کـە قـەت نـەدەکـرا لەودیوی شـیـشـی پەنجـەرەکـانەوە لـە هیچ شـوێنێ بگیرسـێـتـەوە ناچار هەروا مـایەوە و دوور و درێژ ڕوانیمـە ئەوەی، کە ئەم قـسـانەی دەکـرد. جـا بەڕاسـتـیش وەکـو ئەو دەیگوت وابوو. کـراسـێکی هـاودامێنی بێ تەقەڵی سپیی لەبەردا بوو.

جـا ئێـسـتـا، لە پاش چەندین سـاڵ، کـاتێکی ئەم دێرانە دەنـووسم، بیـر لە

مامۆستای کولیبەی ئیلاهییات دەکەمەوە. شەرەفەدین ئەفەندی ماوە، مردووە، نازانم، بەڵام ئەگەر مابێ و ئەم نووسینانەم بخوێنێتەوە، دەڵێ: «نامەردی غایەن. لەسەرێکەوە لافی ئەوە لێ دەدا، کە مادیخوازە و لەسەرێکی دیکەوە دەم لەوە دەدا، کە گوایە وەک قەشە گریتییەکە، لە پاش سەدان ساڵ مریدێکی بوێرکلیجە بەسەر شەپۆلی دەریاوە هاتووەتە خزمەتی و بە دیداری نامبارەکی شاد بووە».

دوای ئەوەی، کە مامۆستای مێژووی کەلام لەم قسانە بووەوە، وەک بڵێی گوێم لە قاقایەکی ئیلاهییانەی بوو.

بەڵام قەیناکا. با ئەو، جەنابی، قاقا پێ بکەنێ. منیش با داستانی خۆم بگێڕمەوە:

سەرێشەکەم بەتەواوی خاو بووەوە. لە دوو توێی نوێن هاتمە دەر. بەرەو ئەوەی پشت پەنجەرەکە چووم. دەستی گرتم. جگە لە خۆم بیست و هەشت ئینسانمان بە قاوشە چەمەنتۆ ئارەقاوییەکەوە لە پرخەی خەودا بەجێ هێشت. هەر هێندەم زانی خۆم لەو شوێنەدا کە قەتمان نەدەدیت، لەو شوێنەدا، کە دیوارەکە و دەریا، یەکیان دەگرت، دیتەوە. لەگەڵ مریدەکەی بوێرکلیجەدا شان بەشانی یەک، شەپۆلە تاریکەکانی دەریامان بڕی و بەرەو پاشەوە بۆ چەندین ساڵ و چەندین چەرخ، بۆ سەردەمی سوڵتان غیاسودین ئەبولفەتح محەمەدی کوڕی یەزیدی گویرەشچی، یا هەر بە سادەیی بۆ سەردەمی سوڵتان محەمەد چەلەبی گەڕاینەوە.

جا ئەو بەسەرهاتەی ئەمن دەمەوێ بۆتانی بگێڕمەوە ئەم سەفەر و گەشتەیە. هەوڵ دەدەم دیمەنی ئەو دەنگ و ڕەنگ و بزاوت و شکڵ و شێوانەی دیتمن، بەش بە بەش و زۆریشی – سەبارەت بە دەست ڕاهاتن بە دێری کورت و درێژ، ناوناوەش بە قافیەوە بنووسم.

ئیدی ئاوها:

## ١

تەختی دیوەخان، تاڵ تاڵ بە بەرگی ئاوریشمی بورسەوە،
چینیی کوتاهیە وەکو باخچەی شین بە دیوارەوە،
شەراب لە سوراحیی زیودا،
بەرخی سوورەوەکراو لە لەگەنی مسدا وەک هەناری ئاڵ بوو،
سوڵتان محەمەد چەلەبی،
مووسای برای بە ژێ کەوان خنکاندبوو،
واتا دەسنوێژی لە لەگەنێکی زێڕدا،
بە خوێنی برا شوشتبوو، چووبووە سەر تەخت، خونکار بوو[١٥].
چەلەبی خونکار بوو ئەمان[١٦]،
ئەو باهۆزەی لە هەرێمی ئال عوسمان هەڵی کردبوو،
هاوارێکی نەهاتی، هۆرەیەکی مردن بوو.
بینایی چاوانی گوندنشین زەعامەت[١٧]،

(١٥) خونکار: لێرەدا بە دوو واتا دێ، خوێنڕێژ، سوڵتان.

(١٦) ئەمان: بەڵام.

(١٧) زەعامەت: بەو زەویوزارە گوتراوە کە بە میر و بەگلەرانی شەڕکەر بەخشراوە و بیست هەزار (ئاقچە) داهاتی هەبووە. لێرەدا دوو واتا دەگەیەنێ: سەرۆکایەتی و زەویوزاری ناوبراویش.

ئارەقەی نێوچاوانی تیمار[١٨] بوو.
جەڕە شکاو تینوو،
سمێڵ بابڕی سپایی میراو بوون.
ڕێبوار لە ڕێگاوبانان هاواری مرۆی بێ زەوی و
هاواری زەویی بێ مرۆیان دەبیست.
لە دووڕیانی ڕێگاوبانان پیشەسازان،
لەگەڵ ڕینگەی شیران، لە بەردەرکەی قەڵا،
لەگەڵ حیلە و کۆڕەکۆڕی ئەسپی شەلاڵ
پیشەسازان لە پیری خۆ نائومێد بوون،
تارومار بوون، بێ ئاسەوار بوون.
ئیدی خونکار بوو، تیمار بوو، باهۆز بوو،
ئاه و زار بوو.

(١٨) تیمار: ئەمەش بەو زەویوزارە گوتراوە کە دەیەکی بە میر و بەگلەران دەدرا.
ئەمیش هەروا دوو واتا دەگەیەنێ: زەویوزار (چارە).

٢

ئەم گۆلە گۆلی ئیزنیکە.

مەندە.

تاریکە.

قووڵە.

لە نێو کەژان،

وەک ئاوی بیر.

گۆلەکانی ئێمە لێرە،

بە تەم و مژن

ماسییەکانیان گۆشتیان بێ پێز،

قۆپییەکانیان تێ لە ئامێز.

مرۆڤی گۆل

ڕدێنیان سپی نابێ دەمرن.

ئەم گۆلە گۆلی ئیزنیکە

شاری ئیزنیکی لە کنە.

لە شارەکەی ئیزنیک

دەزگای ئاسنگەران وەک دڵی شکاو

زارۆک برسی.
مەمکی ژنان وەک بێچووە ماسیی وشککراو
لاوان گۆرانییان ناڵێن.

ئەم شارە شاری ئیزنیکە،
ئەم ماڵە ماڵێکە لە گەڕەکی پیشەسازان
لەم ماڵەدا
پیرێ هەیە بەدرەدین ناو
کورتە باڵا
ڕدێن درێژ،
ڕدێن سپی.

چاوە بەقووڵاچووە ساوایانەکانی زیت و زرنگ،
قامکە زەردەکانی وەک قامکی کەمانچەژەن،
ئەوە بەدرەدینە،
لەسەر کەوڵە مەڕێکی سپی
ڕۆنیشتووە.
بە خەتی تەعلیق
(تەسهیل)
دەنووسێ...

بەرانبەری چۆکیان داداوە و
لە بەردەمیا
وەک لە چیایەک ڕابمێنن
تێی ڕامابوون.

مستەفا بوێرکلیجەی باریکەلەی کەڵەگەت،

سەر تاشراو،

برۆ ئەستوور،

ئەو دەڕوانێ.

تۆرلاق کەمالی پۆز خەرتەل...

ئەو دەڕوانێ.

بەبێ ئەوەی بێزار و وەڕەز بن،

بەبێ تێربوون،

دەڕواننە بەدرەدینی ڕەهەنەی ئیزنیک...

٣

له کەنارێ ژنێکی پێ خاوس دەگریێ.
قەیاخێکی پەت پچڕاوی ماسی گرتن
وا له گۆلێ،
وەک لاشەی پەڕەوڵێ
بەسەر ئاوەوە دەگەڕێ
بەرەو ئەو شوێنەی ئاو دەیبا، دەچێ.

له گۆلی ئیزنیکێ ئێوار داهات
سپاییی دەنگ ئەستووری سەر چیاکان
له ملی ڕۆژیان دا
خوێنیان ڕشته گۆلێ.

له کەنارێ ژنێکی پێ خاوس دەگریێ
ژنی ئەو ماسیگرەیه له سۆنگەی ماسییەکی سازان
به قەڵاوە دەست و پێیان له زنجیر دان.
له گۆلی ئیزنیکێ ئێوار داهات
بەدرەدین دانەوییەوە ئاو هەڵێنجێ
گوێلی لێ دا و ڕاست بووەوە

کاتێ کە ئاو
لە تۆی قامک و پەنجەیەوە
ڕژان و سەرلەنوێ گەڕانەوە
بۆ نێو گۆلێ،
خۆی بەخۆی گوت:
«ئەو ئاگرەی لە دڵما نێڵەنێڵیەتی
ڕۆژ لە دوای ڕۆژ پتر دەگرێ.
دڵم ئاسنی کوتراوەش بێ بەرگە ناگرێ
دڵم وەختە بتوێتەوە...
من هەستاوم شۆڕش دەکەم
هۆ میراتگرانی زەویوزار بۆ فەتح دەچین.
هێزی زانست، پەنیی یەکبوون بەدی دێنین.
ئێمە ئۆل و یاسای دنیا بەتاڵ دەکەین...»

بۆ سبەینێ
قەیاخ لە گۆلێ تێک دەشکێ
لە قەلاڕا سەرێ گلۆر دەبێتەوە
لە کەنارێ ژنێ دەگریێ.
کاتێ سیماونەیی
(تەسهیل)ەکەی تەواو دەکا
تۆرلاق کەمال و مستەفا
دەستی شێخیان بە دڵ ماچ کرد.
بەر و تەنگەی ئەسپی سورخنیان شەتەک دا

لە دەرگانەی ئیزنیکەوە،

شیری ڕووتیان بە قەدەوە،

کتێبی دەسنووس لە خورجا،

بە پڕتاو هەردوو دەرکەوتن...

کتێبەکە

(واریدات) بوو.

## ٤

مستەفا بوێرکلیجە و تۆرلاق کەمال دەستی بەدرەدینیان ماچ کرد و سواری ئەسپەکانیان بوون، یەکێکیان بەرەو ئایدن و ئەوی دیکەیان بەرەو مانیس تێیان تەقاند. ئەمنیش لەگەڵ ڕێبەرەکەمدا ملی ڕێگای ناوچەی قۆنیەم[١٩] گرت و ڕۆژێکیان کاتێ گەیشتینە هایمان[٢٠]:

بیستمانەوە کە مستەفا
لە هەرێمی ئایدن لە قەرەبوروون هەستاوە
فەرمایشتی شێخی تێکرا
بە گوندی ڕاگەیاندووە.

بیستمانەوە
«لە پێناوی ڕزگاریی گشت خەڵکی دنیا لە هەژاری
گۆشتی زەویی وەک پێستی کیژی پازدە ساڵ،
سپی و ناسک، بەش کراوە،
بەگ و ئاغا سەرلەبەر لەسەر دراون

---

(١٩) قۆنیە: شارێکی کۆنە و زۆریش گەورەیە. پێتەختی سوڵجووقییەکان بووە. گڵکۆی مەولانا جەلالەدینی ڕۆمی لەم شارەیە.
(٢٠) هایمان: قەزایەکە سەر بە پارێزگای ئەنقەرە. پێدەشتەکانی زۆر بە برشتە و خەلە و خەرمانی چاک دێنێ و ئاژەڵی زۆرە.

تیمار، زەعامەتی بەگی خونکار
لە دەستیان دەرهێندراون».

بیستمانەوە...
پیاو ئەم هەمووە ببیێتەوە چلۆن دەتوانێ خۆی بگرێ؟
سبەینانێ زوو زوو،
کاتێ مەلێ نامۆ لەو دەشتی هایمانە دەیخوێند
لە ژێر بییەکی سیسەڵدا چەند دەنکە زەیتوونێکمان خوارد.
گوتمان،
«با بگەین»
گوتمان،
«سەیر کەین»
گوتمان،
«با ئێمەش تەکان دەین،
دەست دەینە دەستەندووی هەوجاڕ
ئێمەش سەرێ با ئەم زەوییە بە برایانە
بکێڵین».
هەڵمان کردە کەژ و کێوان
زەردمان بڕی، ماهمان بڕی...

دۆستینە،
من بە تەنیا قەت سەفەر ناکەم.
لە زەردەدا بە هاوڕێ گیانی بەگیانییەکەم
گوت: وا هاتین،

تەماشاکە،

ئەو زەوییەی یەک دوو هەنگاو لە دوامانەوە دەگریا

لە پێشەوە هەروەک ساوا پێ دەکەنێ.

سەیرکە، هەنجیر، درشت، هەر دەڵێی زمرووتە.

چڵە دارمێو لە ژێر هێشووی کارەبادا چرکەچرکیە.

سەیرکە ماسی لە نێو قوڵینەی قامیشدا چۆن هەڵدەپلێن،

پێستی تەڕیان پووڵ پووڵ، بریق بریق دەبریقێن

گۆشتیان وەکو گۆشتی بەرخی ساوا خۆشە،

نەرمە گۆشتیان.

گوتم سەیرکە، ببیە:

مرۆ لێرە وەک خۆڵ، وەک ڕۆژ، وەکو دەریا،

لێرە دەریا، خۆرەتاو، خاک و خۆڵ وەکو مرۆ

بەبرِشتە.

## ٥

پاش ئەوەی زەویوزار بە تیمار و زەعامەتداری خونکار و بەگەکانی خونکارمان بەجێ هێشت و پێمان هاویشتە سنووری وڵاتی بوێرکلیجە، سێ لاومان بەپیرەوە هاتن. هەرسێکشیان بەرگیان وەک بەرگی ڕێبەرەکەم سپی و بێ تەقەڵ بوون. یەکێکیان ڕدێنی لوول، وەکو ئەبەنووسی ڕەش، چاویشی هەر بەو ڕەنگە بوو، سرک و سڵ بوو، پۆزی بەرانی و گەورە بوو. وەختی خۆی لەسەر ئاینی مووسا بووە. ئێستا لە کەڵەمێردانی بوێرکلیجەیە.

دووەمیان چەناگەی چرچ و لۆچ، پۆزی ڕێک و ڕاست بوو. وەختی خۆی کەشتییەوانێکی ڕۆمیی ساقزی بووە. ئەویش هەر لە مریدانی بوێرکلیجەیە.

سێیەمیان بەژن مامناوەنجییەکی چوارشانە بوو. ئێستا بەبیرم هاتەوە. بەو حوسەینەم شوبهاند، کە لە قاوشی جەردەکاندا زیندان کرابوو و ئەو لاوژە کوێستانییەکەی دەگوت. بەڵام حوسەین خەڵکی ئەرزەڕۆم بوو. ئەم خەڵکی ئایدن بوو.

یەکەم قسە ئایدنییەکەیان کردی، گوتی:

«دۆستن؟ دژمنن؟ ئەگەر دۆستن بەخێرهاتن، دژمنن ئەستۆتان لە موو باریکترە».

گوتمان:

«دۆستین».

ئینجا زانیمان کە هینەکانی ئێمە، لەلایەن هۆردووەکەی سیسمان، والیی

ساروخانەوە، ئەوانەی ویستبوویان زەویزارەکان دووبارە بە بەگەکانی خونکار بدەنەوە، لە گەلی و تەنگنا و هەڵدێرەکانی قەرەبوورووندا شکابوون. ئەوەیان کە لە حوسەینی قاوشی جەردەکان دەچوو، دیسان هەلێ دایێ، گوتی:

«ئەو سفرە و خوانە برایانەمان کە، لێرەوە تا دەریای بناری قەرەبوروون درێژ بووەتەوە، بۆیە بە هەنجیری وەک هەنگوین و گوڵەگەنمی وا سەرگران و زەیتوونی وا چەوری ئەمساڵ ڕازاوەتەوە چونکە بە خوێنی دزە سەڵتە سورمەدارەکانمان ئاو دا.»

مژدەکە گەورە بوو. ڕێبەرەکەم هەڵی دایێ گوتی:

«کەواتا، با زوو بگەڕێینەوە، خەبەرەکە بە بەدرەدین ڕاگەیێنین».

ئاناستاسی ڕۆمیی کەشتییەوانیشمان بەگەڵ خۆ خست و هەرکە لە خاکی برایانەی ئەو وەدەر کەوتین، کەوتینە ناو تاریکاییی کوڕانی عوسمانەوە.

بەدرەدینمان لە ئیزنیک، لە کەناری گۆل دیتەوە. سبەینێ بوو. هەوا نماوی و خەمناک بوو.

بەدرەدین گوتی:

«نۆرەی ئێمەیە. با بەرەو ڕۆم ئیلی[٢١] بپەڕینەوە.»

هەر شەوێ لە ئیزنیک وەدەر کەوتین. سوارمان وەدوو کەوتبوون. تاریکیی نێوان ئێمە و سوارەکان بووبوو بە شوورە بۆمان. لە پشت ئەم شوورەیەوە زرمەی ناڵمان بەرگوێ دەکەوت. بەڵەدەکەم لە پێشەوە دەڕۆیشت. ئەسپەکەی بەدرەدین لە نێوان ئەسپە سورخنی من و ئەسپەکەی ئاناستاسدا بوو، ئێمە سێ دایک بووین، بەدرەدین جگەرگۆشەمان. لە ترسی ئەوەی نەکو گەزەن و وەیەکی پێ بگا، هەناومان دەلەرزی. ئێمە سێ منداڵ بووین، بەدرەدین باوکمان. زرمەی ناڵ لە پشت شوورەی تاریکاییەوە هەرچەند نزیک دەبووەوە

---

(٢١) ڕۆم ئیلی: سەرلەبەری وڵاتی باڵکان کە سەر بە ئیمپراتۆریەتی عوسمانلییان بوو.

هێندەی دیکە لە بەدرەدین نزیک دەبووینەوە و پێوەی دەنووساین.

بە ڕۆژ خۆمان دەشاردەوە و بە شەو ڕێمان دەکرد، بڕۆ بڕۆ تا گەیشتینە ئەسفەندیار. لەوێوە سواری گەمیەیەک بووین.

٦

شەوێکیان لە دەریایەکدا تەنیا ئەستێرەکان و

بایەواندارێک هەبوو.

شەوێکیان لە دەریایەکدا بایەواندارێک و تەنیا

ئەستێرەکان.

ئەستێرە لە ژمارە نەدەهاتن.

بایەواندارەکان کوژابوونەوە

ئاو لێڵ و شێلوو و

تا چاو هەتەرکا ڕاست و ڕەوان.

ئاناستاسە سوورفل و بەکری دوڕگەیی

لە هەڵمەتی سەوڵ لێدانا بوون.

من و قۆچ ساڵح لە پێشەوە بووین.

بەدرەدین

پەنجەکانی لە نێو ڕدێنیدا،

گوێی بۆ شڵپ و هۆڕی سەوڵان هەڵخستبوو.

من گوتم:

– ئەرێ بەدرەدین!

لە ئەستێرە بەولاوە هیچی تر

نابینین بەسەر بایەواندارە چاو خەواڵووەکانەوە.
لە هیچ کوێوە سرتە نایە.
گرم و هۆڕی دەریامان
نایەتە گوێ.
تەنیا ئاوێکی تاریکی بەستەزمان،
تەنیا پرخەی خەوی.
پیری ڕدێن درێژ
دایە پێکەنین،
گوتی:
– تۆ مەڕوانە کپیی هەوا
دەریا دەنوێ دەنوێ لە پڕێکا بەخەبەر دێ.
شەوێکیان لە دەریایەکدا تەنیا ئەستێرەکان و
بایەواندارێک هەبوو.
شەوێکیان بایەواندارێک بە دەریای ڕەشدا تێ پەڕی
بۆ دەلی ئۆرمان[٢٢] دەچوو،
بۆ دەریای دار و درەخت...

(٢٢) دەلی ئۆرمان: دارستانە شێتە، لێرێکە لە بولغارستان.

٧

لەم لێرە کە دەڵێ ئۆرمانە وەستاوین،
لە دەریای دار و درەخت خێوەتمان هەڵ دا.
«بە زمانی دڵ دەمانگوت دیارە بۆچی هاتووین دیارە».
لە هەر لقێکەوە بۆ گوندێک شەهێنێکمان هەڵ دا.
هەر شەهێنێک سەت شێری دوای خۆی خستبوو، هاتبوو.

گوندی مەزرای بەگ، شاگرد بازاڕیان سووتاندبوو،
خەڵکی، کۆت و زنجیریان پچڕاندبوو، هەموو هاتبوون،
هەرچی سەر بەئێمەی خەڵکی ڕۆم ئیلی بوون، سەرلەبەر،
دەستە دەستە ڕژابوونە دەریای دار و درەختەوە،
هاتبوون...
ڕۆژی حەشر بوو
تەڕ و وشک لێک جیا نەدەکرایەوە
گۆشت، مرۆ، ڕمب و تیر و شیر، گەلا، پێست،
ڕەگ و ڕیشەی مێشە،
تێک چڕژابوون.
نە دنیای وا دیترابوو،

نه گرم و هۆڕی وا بیسترابوو،

لەوەتی دەلی ئۆرمان هار بووبوو...

٨

ئانساستاسمان لە دەلی ئۆرمان، لە هۆردوگای بەدرەدین بەجێ هێشت و لەگەڵ ڕێبەرەکەمدا بۆ گەلی بۆڵوو[٢٣] چووین. پێش ئێمە هیی دیکەش بە مەلەوانی لە دەریا پەڕیبوونەوە. بە زۆری لە سەرێنیی پیلانێکەوە. ئێمەش بە مەلەوانی لە دەریا پەڕینەوە ئەوبەر. بەڵام ئەو شتەی ئێمەی وەکو ماسییەک تاو کردبوو ئارەزووی دیتنی ڕوخساری ئافرەتێ نەبوو لەبەر شەوقی مانگەشەو، بگرە ئەمجارە کاری خەبەرێک بوو کە دەبوو بە ڕێگای ئیزمیردا، لە شێخەوە بە مستەفای ڕاگەیێنین لە قەرەبوروون.

کاتێ گەیشتینە کاروانسەرایەکی نزیک ئیزمیر بیستمانەوە کە بایزید پاشا دەستی کوڕە دوازدە ساڵانەکەی پاتشای گرتووە و لەشکری ئەنەدۆڵی خڕ کردووەتەوە.

لە ئیزمیر زۆر گیر نەبووین. لە شار دەرچووین ملی ڕێگای ئایدنمان گرت، لە نێو باخێکدا، لە ژێر دارگوێزێکدا، نواڕیمان چوار چەلەبی شووتییان بۆ ساردبوون، خستووەتە سارداوێکەوە، قسە دەکەن، دەحەسێنەوە. هەریەکە جۆرە بەرگێکیان لەبەردا بوو. سیانیان مێزەربەسەر بوون، یەکێکیان فێست لەسەر بوو. سڵاویان کرد، سڵاومان دانەوە. تومەز یەکێ لە مێزەربەسەرەکان نەشرییە. دەڵێ: «سوڵتان محەمەد، بایزید پاشا دەنێرێتە سەر بوێرکلیجە. بوێرکلیجە خەڵک بۆ مەزەبی ئیباحییەت بانگ دەکا.

---

(٢٣) گەلی بۆلۆو: شارۆکەیەکە لە نزیک تەنگەی دەردەنیلەوە.

مێزەربەسەری دووەمیان شوکروڵای کوڕی شەهابەدین دەبێ. دەڵێ:

– ئەم سۆفییە زۆر کەسی تێ ورووکاوە. ئەمانیش بەدیار کەوتن، چین، کردار و ڕەفتاریان بەپێچەوانەی شەریعەتی محەمەدییە. سێیەم مێزەربەسەریان عاشق پاشازادەیە دەبێ، دەڵێ:

– پرسیار: ئەرێ بەڕاست ئەگەر بوێرکلیجە لەتوپەت کرا، بەئیمانەوە دەمرێ، بەبێ ئیمان دەمرێ؟

– وەڵام: خوا بۆ خۆی دەزانێ، چون ئێمە لە حاڵی مردنی ئەو بێ ئاگاین... چەلەبییە لە سەرەکەیان مامۆستای مێژووی کەلام دەبێ لە کولییەی ئیلاهییات، سەیرێکی کردین، چاوی لێ داگرتین و بێ ئەوەی هیچ بڵێ، فێڵبازانە، بزەی هاتێ.

ئێمەش ئەسپانمان وەبەر مامزان دا و دامان قلاشت. ئەوانەی لە نێو باخێکدا، لە ژێر دارگوێزێکدا شووتییان هاویشتبووە ساردەوەوە و بەدەم حەسانەوەوە قسەیان دەکرد، لە پشت تۆزی ناڵەکانمانەوە بەجێ هێشت و گەیشتینە ئایدن، قەرەبورون. خۆمان گەیاندە بوێرکلیجە.

٩

گەرمایە.

گەرمایە،

گەرما کێردێکی مەودا کولی دەستوو خوێناوییە.

گەرمایە.

گەرمایە

هەور و هەلا توند و پڕ بوون.

هەور و هەلا بەتاڵ دەبن

بەتاڵ دەبن.

بەبێ بزاوت

لە ڕەوەزانەوە ڕوانی

هەردوو چاوی وەک دوو خەرتەل لەو پێدەشتە نیشتنەوە.

لەو جێگایەی کە ئافرەتی هەرە نەرم و هەرە سەرسەخت

هەرە ڕژد و هەرە چاوتێر

هەرە دڵدار

هەرە گەورە و هەرە بەدەو:

خاکە

لە هەر کوێ بێ دەزێ

دەزێ.

گەرمایە.

لە چیاکانی قەرەبوروونەوە ڕوانییە

ئاسۆی پاومانی ئەم خاکە

هەردوو برۆی وێک هێناوە

ئەوەی دەهات میر مراد بوو

ئەوەی ملی ساوای لە دەشت و دەر

وەک گوڵاڵە هەڵدەکێشا

کەوتبووە نوای زریک و هۆڕی ڕووت و قووت

سوتمانێکی پێنج جوقەدار لەوبەرە

دەهات و بەری ئاسمانی تەنیبوو

فەرمانی هومایوون بۆ میر مراد دەرکرابوو

بەرەو ئایدن بەڕێ کەوێ

هەڵکاتە سەر جێگری بەدرەدین، مستەفای زەندیق.

گەرمایە.

جێگرەکەی بەدرەدین، مستەفای زەندیق ڕوانی

مستەفای گوندی ڕوانی،

بێ سام و ترس

بێ تووڕەبوون

بێ پێکەنین

ڕاستەوڕاست و زیت زیت ڕوانی.

ئەو ڕوانی.

ئافرەتی هەرە نەرم و هەرە سەرسەخت

هەرە ڕژد و هەرە چاوتێر

هەرە دڵدار

هەرە گەورە و هەرە بەدەو:

خاکە

لە پرێکا دەزێ

دەزێ.

ئەو ڕوانی.

ئازاکانی بەدرەدین لە ڕەوەزانەوە ڕوانییانە ئاسۆ،

ئەم خاکە ئاکامی لەگەڵ باڵی باڵدارێکی فەرمانداری مەرگا

بەرەبەرە نزیک دەبووەوە.

هەرچی ئەوانەی لە ڕەوەزانەوە دەیانڕوانی

ئەم خاکە بە ڕەز و هەنجیر و هەنارە،

کە کوڵکیان لە هەنگوین زەردتر بوو،

بە خۆ و پەزی شیر لە هەنگوین شیرینتریانەوە

بە ئەسپی ناوکێل زراو و بژ و یاڵ شێرانەیانەوە.

بێ شوورە و وارش، بەبێ کەوشەن

وەکو خوانی برایەک هەڵیان دابووەوە.

گەرمایە.

ڕوانی.

بوێرانی بەدرەدین ڕوانییانە ئاسۆ...

ئافرەتی هەرە نەرم و هەرە سەرسەخت

هەرە ڕژد و هەرە چاوتێر

هەرە دڵدار
هەرە گەورە و هەرە بەدەو
خاکە
لە پڕێکا دەزێ
دەزێ.

گەرما بوو.
هەور و هەڵا پڕ بوون
هاکا لەپڕ یەکەم دڵۆپ
وەک قسێکی شیرین و خۆش
کەوتە زەوی
هاکا –
– لە پڕ
وەک لە ڕەوەزان هەڵوەرێ
وەک لە ئەسمانان بباریێ
وەک لە زەویوزارا – بڕوێ
وەک هەرە دوا ئاسەوارێ کە ئەم زەوییە بیبەخشێ.

ئازاکانی شێخ بەدرەدین لە لە شکری میر ڕاپەڕین
بەکراسی بێ تەقەڵی هاودامانی سپییەوە
بە سەری ڕووت
بە پێ خاوسی و بە شیری ڕووت
شەڕێکی خەست و خۆڵ ڕووی دا
گوندییە تورکەکانی ئایدن،

کەشتییەوانی ڕۆمیی ساقز
جوولەکە پیشەوەرەکان
دە هەزار زەندیقی هاوڕێی مستەفا لوریان بوونێ
وەک دە هەزار تەور لە لێڕی دژمن ڕاچوون
ڕیز ڕیز ئاڵا کەسک و سوّران
مەتاڵ زەرکوت، خوود توجی زەرد
لەت لەت کران بەلاّم،
زەردەپەڕێ، لە نێو ڕەهێڵەی باراندا
لە دە هەزار ما دوو هەزار

لە دە هەزار هەشت هەزاریان بەخشی...
بۆ وەی هەموو بەیەک دەنگ لاوژان بێژن
بەیەکەوە تۆڕان لە ئاوان هەڵێنن
پێکەوە ئاسن وەک نیگار بنەخشێنن
بۆ ئەوەی چوونیەک زەویزاران بکێڵن
بۆ ئەوەی بتوانن هەنجیری شیلەدار بخۆن
بۆ ئەوەی بتوانن
بێژن:
گۆنای یاری لێ بترازێ
لە گشت شتان
لە گشت شوێنان
گشت چوونیەکین.
لە دە هەزاران هەشت هەزاریان پێشکێش کرد...
بەزین.

زاڵ بوو، خوێنی مەودای شیریان
بەکراسی بێ تەقەڵی سپی سڕییەوە
ئەو زەوییەی کە برایانە کێڵدرا
وەک لاوژەیێ یەک دەنگ گوترا
لە نێو کۆشک و تەلارەکەی ئەدرنەدا سمشێل کرا.
ئەمە ئاکامی ناچاریی باری مێژوو و کۆمەڵ و ئابووری بوو
وا شکایەوە!
مەیڵێ، دەیزانم!
ئەوەی دەتەوێ بیڵێی، سەری لەبەر دادەنوێنم.
بەڵام چ لەگەڵ ئەم دڵە دەکەی
ئەو، فرِ لەم زمانە نازانێ
ئەو دەڵێ: «گەردوونی پشت کووڕ،
هۆ هۆ چەرخی قەحپە».
یەکە یەکە
لە ئانێکا
شان و پشت ڕێ ڕێ بەزەبری قامچی
سەر و چاو شەڵاڵی خوێن
بە پێ خاوسی بەسەر دڵما تێ دەپەڕن،
لە ناوچەکانی ئایدنڕا دێن، دەڕۆن بە زیوانی قەرەبوروون...

١٠

له تاریکاییدا وەستان
ئەو هەڵی دایێ، گوتی:
«له شاری ئەیاسڵۆغ بازاڕیان دانا،
یاران دیسان
دیسان ملی کێیان پەڕان!»

باران
بێ پشوو دەباری.
ئەوان گوتیان:
«هێشتا بازاڕ
دانەندراوە
دادەندرێ.
ئەو بایەی دێ
نەیخستووە
دەیخا.
هێشتا له ملی
نەدراوە

دەدرێ»،

کە تاریکی پەردە پەردە نەماوی بوو

بەدیار کەوتم لەو جێگایەی وانی لێ بوون

من تێ هەڵچووم، گوتم:

«دەرگای شاری ئەیاسلۆغ کوا؟

پیشانم دە با تێ پەڕم

قەڵای هەیە؟

بڵێ بیرمێنم.

باج دەستێنن؟

تاکو نەیدەم»،

ئەوجا ئەو تێ هەڵچوو، گوتی:

«دەرگای شاری ئەیاسلۆغ زۆر تەنگ و تووشە

هاتوچۆی پێدا ناکرێ

قەڵای هەیە،

هەروا بە سانایی نارمێ

برۆ مێرخاسی ئەسپ شێ ئاڵ

برۆ پەی کاری خۆت برۆ!...»

گوتم: «دەچم و دێمە دەر!،

گوتم: «دەسووتێنم، دەرووخێنم!»

گوتی: «باران لێی کردەوە

بەرەبەیان سپێدەی دا

عەلی سەربڕ

بانگی مستەفای

دەکرد

برۆ مێرخاسی ئەسپ شێ ئاڵ

برۆ پەی کاری خۆت برۆ…»

گوتم: «یاران

دە، لێم گەڕێن

دە، لێم گەڕێن

یاران

توخوا، با، بیبینم

با، بیبینم

وا مەزانن

بەرگە ناگرم

مەزەن مەکەن

سووتانەکەم

تا بە خەڵکی هەموو دنیای ڕانەگەیێنم ناسووتێم.

یاران

مەڵێن «ناشێ»

لە خۆڕایی مەڵێن «ناشێ»

خۆ ئەمە هەرمێ نییە بەربێتەوە

هەرمێ نییە

برینداریش بێ لە لکی بەرنابێتەوە

ئەم دڵە

ئەم دڵە وەک کێشکە ناچێ،

وەکو کێشکە

یاران

دەزانم

یاران

دەزانم لە کوێیە، دەزانم ئەو حاڵی چییە

دەزانم

چوو، ئیتر ناگەڕێتەوە

دەزانم

لە کەژاوەی وشترێکدا

بە چوارمێخەیەکی خوێناویدا

لەش ڕووت و قووت

لە هەردوو دەستییەوە چوارمێخە کێشراوە

یاران

لێم گەڕێن

لێم گەڕێن،

یاران

با بچم

یەکێ لە پەیڕەوانی بەدرەدین

مستەفا بوێرکلیجە

ببینم...

لە ملی دوو هەزار دەدرێ

مستەفا و چوارمێخەکەی،

سەربڕ، بن تاو، بیور

هەموو شت تەیار

هەموو شت تەواو.

ژێرزین سورمەچنی سوور

ئاوزەنگی زێڕ

ئەسپی شێ بۆر

مێردمنداڵێ بەسەر پشتییەوە

پاتشای ئەماسیە، شازادە سوڵتان مراد،

بە تەنیشتییەوە

نازانم لە کام جوقەی بەرم بایزید پاشا

سەربڕ بیوری داوەشاند

ملی ڕووت لەت کرا وەک هەنار

وەک سێو لە لکی سەوز بەربووەوە

یەک لە دوای یەک بەربوونەوە.

هەر سەرێ کە بەربووەوە

مستەفا لە چوارمێخەوە

سەیرێکی کرد بۆ ئاخر جار

هەر سەرێ کە بەربووەوە

مووی نەبزووت:

هەر هێندەی گوت،

– فریا کەوە بابا سوڵتان

لەوە زیاتر هیچی نەگوت...

## ١١

بایزید پاشا دێتە مانیسا. تۆرلاق کەمال لەوێ دەدۆزێتەوە، ئەویش لەوێ هەڵدەواسێ. دە ویلایەت دەپشکێندرێ، ئەوەی لەنێو دەبرێ لەنێو دەبرێ. دە ویلایەت تیمار تیمار لە پەیڕەوانی بەگانی خونکار بەش دەکرێ.

ئەمنیش لەگەڵ ڕێبەرەکەمدا لە دە ویلایەت ئاوا بووین. قەل و داڵاش بەسەر سەرمانەوە دەسووڕانەوە و دەیانقیڕاند و بەنێو دەرە و دۆڵان دەکەوتن و لە لاشە و کەلاکی کۆرپەژن و منداڵی ساوا، کە هێشتا خوێنیان وشک نەبووبووەوە دەورووکان. داڵاش لە جیاتیی لاشەی پیاوی پیر و لاو کە لەو بەرڕۆژە کەوتبوون، گۆشتی ژن و منداڵیان پێ خۆشتر بوو و ئەمەش نیشانەی ئەوە بوو، کە زگیان چەند تێروتەسەل بوو.

لە ڕێگا تووشی بەگە لۆزەنگەرەکانی خونکار بووین.

بەگەکانی خونکار، کە وەک بای باخێکی سیس هەڵاتوو بە هەزار حاڵ خۆی بەکێش بکا و بەسەر زەوییەکی لەتوپەتکراودا ڕەت بێ، بە جوقە و تێلتاوسی ڕەنگاوڕەنگ و دەهۆڵ و چەنگ و چەقەنەوە گەڕانەوە بۆ تیمارەکانیان و دامەزران، ئێمە دە ویلایەتمان بەجێ هێشتبوو و گەلیی بۆڵوو لەوبەرەوە بەدیار کەوت.

بەڕێبەرەکەم گوت:

– بڕستم لێ بڕاوە، ناتوانم بە مەلەوانی لە دەریا بپەڕمەوە.

قەیاخێکیان پەیدا کرد.

دەریا شـەپۆلاوی بـوو. ڕوانیـمـە قـەیاخـەوانـەکـە. کـوتومت وەک ئەو وێنەیە دەچوو، کـــە لـە بەرگـی ناوەوەی کـــتـــێـــبـــێکـی ئەڵـمـــانیـم دەرێنـابوو و بـە ژوورسـەرمـەوەم هەڵواسـیبـوو. سـمـێڵـە ئەسـتـوورەکـەی وەک ئەبەنۆس ڕەش، ڕدێنـی پان و سـپـی بوو. لەوەتـی هەم هـیی وا ڕووخـۆش و دەم و پل و پاراوم نەدیوە.

گەیشـتبووینە ناوەندی گەلییەکە. دەریا بێ وچان دەشکا و ئاو بەناو بایەکی ڕەنگ قـوڕقـوشـمـاویدا لە ژێر قـەیاخـەکـەمـانـەوە ڕێی دەکـرد و دادەشکا، قەیاخەوانەکەمان، کە لە وێنەکەی ژوورسەرم دەچوو، گوتی:

–ئازاد و دیل، ئاژاوەگـێـڕ و بە پێـڕۆ، دەرەبەگ و کـۆیـلەی زەوی، وەسـتـا و شـــاگـــرد، ئەوانـەی بەوشـــەیەک دایان دەڕزانـد و دادەڕزان لە هـاودژییـــەکـی هەتـاهەتاییـیـەوە دەگـژ یەکـرا چوون و هـەندێ لە بنەوە و هـەندێ بە ئاشـکرا خەباتێکیان بێ لێ بڕان بەرپا کرد.

## ١٢

هەرکە پێمان هاوێشتە خاکی ڕۆم ئێلی بیستمانەوە سوڵتان محەمەد چەلەبی دواییی بەگەمارۆدانی قەڵاکەی سالۆنیک هێنابوو و چووبووە سەرەز. بۆ ئەوەی تۆزێ زووتر بگەینە دەلی ئۆرمان شەو و ڕۆژمان لێک دا و ڕۆیشتین.

شەوێکیان لە پەنا ڕێگاکەدا دانیشتبووین پشوومان دەدا، لەوبەرەوە سێ سوارمان دیت لە دەلی ئۆرمانەوە دەهاتن، بە بەردەمماندا بە پڕتاو بۆ شاری سەرەز دایان کێشا. یەکێ لە سوارەکان شتێکی وەک خورجینی بەتەرکەوە بوو، وەک تارماییی مرۆ دەچوو. مووی سەرم ڕەپ بوون. بەرێبەرەکەم گوت:

من بەدەنگی ئەم نالانە ئاشنام
ئەم ئەسپە ڕەش ڕەشە ئارەق خوێناوییانە
کە لەم ڕێگا تاریکەوە بە چوار ناڵ دەڕۆن
هەروا دیلی دەست بەستەیە بەتەرکیانەوە و دەڕۆن

من بەدەنگی ئەم نالانە ئاشنام
ئەمان
سبەینانێ
وەک لاوژەیەکی دۆست لە خێوەتەکانمان لایان دا
نانمان لەگەڵدا بەش کردن
ئای کە هەوا خۆش بوو

ئای دڵ چەند بە هیوا خۆش بوو
گومان،
سەرداره دۆستەکەمان لە خەوی شیریندا بوو...

من بەدەنگی ئەم ناڵانە ئاشنام.
ئەوان
شەوێکیان
لە خێوەتەکانمانەوە بە پڕتاو دوور کەوتنەوە
نۆبەدارەکەیان لە پشتەوە بەر خەنجەر دابووین
بەتەرکیانەوە
هەرە بەنرخەکەمان
لە پشتەوە باڵ بەست کرابوو.

من بەدەنگی ئەم ناڵانە ئاشنام
ئەمانە دەلی ئۆرمانیش دەیانناسێ...

جا بەڕاستی زۆری نەبرد، زانیمان دەلی ئۆرمانیش بەدەنگی ئەم ناڵانە ئاشنا بوو. چونکە هەر پێمان هاوێشتبووە جەنگەڵستانەکەوە، بایزید پاشا بە ڕا و تەگبیرە بەڕێ و شوێنەکانی پیاوی بە جەنگەڵستانەکەوە وەرکردبوو و خزابوونە ناو بنکەکانەوە پێیان هاوێشتبووە پۆستنیشینییەکەی بەدرەدینەوە و شەوێکیان شێخمانیان لە نێو چادرەکەی، لە خەودا وەگیر کەوتبوو و بردبوویان. تومەز ئەو سێ سوارەی لە ڕێگا تووشمان هاتن، باب ئاغای شەرفرۆشانی مێژووی عوسمانلی بوون و دیلەکەی تەرکیشیان شێخ بەدرەدین بوو.

١٣

ڕۆم ئیلی، سەرەز و
تەرکیبێکی ئیزافیی کۆن:
حوزووری هومایوون
لە گۆڕێ
وەک شیرێکی لە زەوی چەقیو، ڕێک و ڕاست
پیرەمێردەکەی لەمەڕ خۆمان
خونکار بەرانبەری
لێکیان ڕوانی

خونکار ویستی:
پێش ئەوەی ئەم کوفرە موجەسسەمە یخ بدرێ
پێش ئەوەی دوا قسە بە پەت بدرێ
با هەندێکیش شەرع هونەر بنوێنێ
بە داب و دەستوور کارەکە حەل کرێ
حازر مەجلیس
مەولانا حەیدەریان پێ دەگوت
تازە لە وڵاتی عەجەمڕا تەشریفی هێنابوو

پیاوێکی دانشمەندی گەورە
ردێنی خەناویی بۆ سروشی خوایی نەوی کرد
گوتی: «ئەمە ماڵی حەرامە بەڵام،
خوێنی حەڵاڵە».
کاری حەل کرد...

ئاورِ لە بەدرەدین دراوە
گوترا: «خۆشت قسەیێ بکە».
گوترا: «حەسێوی بێ خواییت بدە».
بەدرەدین
لە کەمەرانەوە ڕوانییە دەرێ
دەرەوە خۆرەکەی خۆش بوو
لک و پۆپی دارێکی لە حەوشە ڕواو
مەرمەرِ بە ئاوی خورِ سواو
بەدرەدین بزەی هاتێ.
قووڵاییی چاوی بریقاوە
گوتی: مادامێ ئەم جارە بەزین
هەرچی بکەین، بڵێین زیادە.
ئیتر بەتانیدا نارِۆم
مادام فەتوا بۆ ئێمەیە بیدەن با مۆرێکی پیا نێین...

١٤

باران پڕووشە دەکا،
بەترسەوە
بەدەنگی نزم
وەک چرپەی خەیانەتکاری.

باران پڕووشە دەکا،
وەک ترپەی پێی سپی و ڕووتی لە ئاین وەرگەڕاو
بەسەر خاکی تەڕ و تاریکدا ڕابکا.

باران پڕووشە دەکا،
لە بازاڕی پیشەوەرانی سەرەز
بەرانبەری دووکانی مزگەرێ
بەدرەدینم بەدارەوە هەڵواسراوە.

باران پڕووشە دەکا،
شەوگار درەنگە و بێ ستێر
بە لقێ داری بێ وەڵگی تەڕ بوو لەبەر باران
گۆشتی ڕووت و قووتی شێخمە

شۆڕ بووەتەوە.

باران پڕووشە دەکا،
بازاڕی سەرەز لاڵ و بێ زوان،
بازاڕی سەرەز کوێر.
هەوا پڕ لە خەمی بێ زوانی و نەبینین کوێرەوە بێ
بازاڕی سەرەز دەموچاوی بە دەستی پۆشیوە.
باران پرووشە دەکا.

## کراسەکەی شەفیق تۆڕنەچی

باران پڕووشـەی دەکرد. لـە دەرەوە، لە پشت شیشـەکانـەوە، لە سـەرووی ئاسـۆ بەهەور و هەڵاکەی سـەر دەریاوە، سـپێدەی بەیان بەدیار کـەوتبـوو. ئەو ڕۆژەم زۆر چاک لە بیرە. لە پێشـا، هەستم کرد دەستێ بەسـەر شـانمەوەیە. کە ئاوڕم دایەوە، شەفیق تۆڕنەچی بوو. چاوە زیت و گەشـە ڕەشەکانی لـە چاوم بڕیبوو، گوتی:

– وا دیارە ئەم شەو باش نەنووستووی؟

ئیدی دەنگی زرەی کـۆت و زنجیـری ئەشـقیـا و ڕێگران لە قـاوشـی سـەرەوە نەدەهـات. دنیـا تەواو ڕوون بووبـووەوە. وا دیاربـوو لە پرخــەی خــەودا بوون. فـیـتـووی پاسـەوانان، ئیـدی بـەو چاشـتـانـە مـانـای لەدەست دابوو، ڕەنگی دەسڕایەوە و تیژی و زەقیی خەتەکانی، کە لە تاریکاییدا نەبێ بەدیار ناکەوێ، نەرم و خاو بووبووەوە.

دەرگای قـاوشـەکە لە دەرەوە کرایەوە. کوڕگەل، یەکـەیـەکە، بەخـەبـەرهـاتن. شەفیق دەپرسێ:

– ئەوە چیتە، حاڵت زۆر شڕ و شپڕێوە؟

منیش بەسـەرهـاتی شـەوێ بۆ شـەفیق دەگێڕمـەوە.

– بەچاوی خۆمم دیت. هـاتـە بەر ئەم پەنجەرەیە. کراسـێکی سپیی بێ تەقەڵ و دروومـانی لەبـەردا بوو. دەسـتی گـرتم. شـان بەشـانی، ڕاسـتـتـر بڵـێم، بە ڕێبەرایەتیی ئەو سەفەرێکم کرد...

شەفیق تۆڕنەچی پێ دەکەنێ. پەنجەرەکەم پیشان دەدا، دەڵێ:

– تۆ ئەم سەفەرەت نەک لەگەڵ مریدەکەی مستەفا، لەگەڵ کراسەکەی مندا کردووە. بڕوانە، دوێنێ شەوێ هەڵم واسی. هێشتا هەر بە پەنجەرەکەوەیە...

منیش پێ دەکەنم. کراسەکەی شەفیق تۆڕنەچی، کە لە بزاوتەکەی بەدرەدینی کوڕی قازیی سیمانەدا، ڕێبەرایەتیی دەکردم لەسەر شیشەکان هەڵدەگرم. شەفیق کراسەکەی لەبەردەکا. هاوڕێیانی قاوشەکە هەموو، ئاگایان لە (سەفەر)ەکەمە. ئەحمەد دەڵێ:

– جا ئەوە بنووسە. (داستانێکی بەدرەدین)مان دەوێ. منیش چیرۆکێکت بۆ دەگێڕمەوە، دەیخەیە دوای کتێبەکەوە... جا، وا چیرۆکەکەی ئەحمەد دەخەمە دوای کتێبەکەوە.

## چیرۆکەکەی ئەحمەد

بەر لە شەڕی باڵقان بوو. نۆ ساڵان بووم. لەگەڵ باپیرمدا، لە ڕۆم ئیلی، لە ماڵی گوندییەک بووین بە میوان. گوندییەکە چاوشینێکی ڕدێن خورمایی بوو. ترخێنەی پڕ لە بیبەری سووری زۆرمان فڕ کرد. زستانە. زستانێکە لە زستانە وشکە وەک کێردی تیژ لە هەساندراوەکان.

ناوی گوندەکەم لە بیر نەماوە. تەنیا ئەوە نەبێ، ئەو جەندرمەیەی تا سەر ڕێگاکە بەگەڵمان کەوت، دەیگوت، ئەم گوندییانە هەرە سەرەڕۆ و هەرە باج نەدەر و هەرە سەرشەقی ئەم ناوەن.

بەلای جەندرمەکەوە، ئەمانە نەموسڵمان بوون، نەگاور بوون، نەقزڵباش بوون. بەڵام نەک قزڵباشی تەواویش.

ئێستاش لە بیرمە کە چووینە ناو گوندەکەوە. ڕۆژ لە ئاوابووندا بوو. ڕێگاوبان بەستبووی. لە ڕێگا، شەختەی سەر گۆلاو، وەک شووشەی بەبریق و باق سوور دەچوونەوە. هەر لە بەراییی شوورەی گوندەوە، کە خەریک بوو لەگەڵ تاریکاییدا تێکەڵ دەبوو سەگێکمان بەپیرەوە هات. بەڵام چۆن سەگێ، زل و زەلام، لە ناو تاریکاییەکەدا لە خۆی گەورەتر دیاربوو. دەحەپی. گوتم «ئەوە چییە؟» سەرم لە پشت ئارەوانچییەکەوە برد، قەمچیی ئارەوانچییەکە بە مەچەکیەوە بەر دەموچاوم کەوت و بەرز بووەوە، وەک فیشکەی مار، شریخەیەکی باریکی لێوە هات، بەر تەپڵی سەری سەگەکە کەوت. هەر ئەودەمی، دەنگێکی گڕم بەرگوێ کەوت:

– هۆو، پێت وایە، ئەوەی لێی دەدەی گوندییە و خۆشت قایمقامی؟ باپیرم لە ئارەوانەکە هاتە خوار، بە خاوەنە دەنگ گڕەکەی سەگەکەی گوت «مەرحەبا» قسەیان کرد. لە پاشان خاوەنە چاوشینە ڕدێن خورمایییەکەی سەگەکە بوو بە خانەخوێمان.

زۆرم قسەی سەردەمی منداڵی لە بیر ماون. مانای زۆریانم، کە بەرەبەرە گەورە بووم، دەرک کرد. سەرم لە هێندێکیان سوڕما، بە بڕێکیان پێ کەنیم، بە هێندێکیان تووڕە بووم. بەڵام هیچ قسەیێ، لەوانی بە منداڵی لە گەورەم بیستوون، هێندەی قسەی ئەو شەوەی، لە گوندییە چاوشینەکە و باپیرمم بیست، بە درێژاییی ژیانم کاری تێ نەکردووم. باپیرم دەنگی زۆر نەرم و ماقووڵ و چەلەبییانە بوو. هەرچی دەنگی ئەوی دیکەیان بوو گڕ و تووڕە و خرسن بوو و بەبڕوا و شایی بە خۆبوونەوە قسەی دەکرد.

دەنگە گڕەکەی ئەو دەیگوت:

«بە خواستی خونکار و فەتوای مەولانا حەیدەری ئێرانی، لاشەی بەدرەدین، لە سەرەز، لە ناو بازاڕ، ڕووت و قووت، بە دارێکی بێ گەڵاوە هەڵواسرابوو، لەسەرەخۆ بە چەپ و ڕاستدا جۆڵانەی دەکرد. شەو بوو، لەسەر سیلەی بازاڕەوە، سێ زەلام بەدیار کەوتن. یەکێکیان ئەسپێکی بۆری یەدەگی پێ بوو. ئەسپێکی بێ زین. هاتنە ژێر ئەو دارە بەدرەدینی پێوە هەڵواسرابوو. ئەوەی لای چەپەوەیان سۆلەکەی داکەند. بەدارەکەدا هەڵگەڕا، دەستی لە بن ڕدێنە درێژە سپییەکەی بەدرەدینەوە برد، خەریک بوو گرێی گوریسە تەڕە سابووناوییە وەک مار، بە ملە باریکەکەیەوە شەتەکدراوەکەی دەبڕی. مەودای کێرد لە گوریس ترازا، یەکسەر بەر ملە بستێ درێژبووەوەکەی لاشەکە کەوت. خوێنی لێ نەهات. کورە ڕەنگی زەرد هەڵگەڕا. لە پاشان، دانەوییەوە، برینەکەی ماچ کرد، ڕاست بووەوە. کێردەکەی تووڕ هەڵدا، دیسان تێ هەڵچووەوە، گرێ لە نیوە پتر بڕاوەکەی، بەدەستی کردەوە، باوکێ جگەرگۆشەیەکی لە خەو ڕاچووی باوەشی، چۆن لە هامێزی دایکی دەکا، ئەویش لاشەکەی بەدرەدینی بەو چەشنە بەباوەشی ئەوانی خوارێ سپارد.

ئەوانیش لاشـــەی ڕووتیـــان لەســـەر ئەســـپی ڕووت دانا. ئەوەی وەســـەر دار کـــەوتبـــوو هـاتە خـــوار. لە هـەمـــووان لاوتـر ئەو بـوو ســـەری ئـەســـپـــە ڕووتە یەدەگەکەی بە لاشەی ڕووتەوە، ڕاکێشا، هات بۆ گوندەکەی ئێمە. لاشەکەی لەو ســـەر یاڵە، لە بن دارە ڕەشـــەکـە ناشت، دوایی ســـوارەکـانـی خـونکار گوندەکەیان پشکنی هەرکە سوارەکان ڕۆیشتن، لاوەکە لاشەکەی لە بن دارە ڕەشـەکە دەرێنا. گوتی نەوەکا سوارەکان جارێکی دیکە بگەڕێنەوە، لاشـەکە بدۆزنەوە، بردی، ئیدی نەگەڕایەوە.

باپیرم دەپرسێ:

– جا تۆ لە ڕوودانی ئەمە، بەو چەشنە دڵنیای؟

– بێگومان. ئەمە باپیرم، باوکی دایکم بۆی گێڕامەوە. ئەویش باپیری بۆی گێڕاوەتەوە. ئەویش باپیری باپیری بۆی گێڕاوەتەوە. ئیدی پشتاوپشت هەروا دەڕوا...

جگە لە ئێمە، هەشت نۆ دە گوندییێ لە ژوورێ بەدەوری ئاڵقەی ڕووناکییە بەڵەکەکەوە، کە ئاگردانەکەی بەڕەنگی سوور ڕەنگ کردبوو، دانیشتبوون، ناوبەناو یەک دووانێکیـان دەبزوون، دەسـتـیـان، یا لایەکی دەمـوچاویان، یا لاشانێکیان بەر ئاڵقە ڕووناکییەکە دەکەوێ، سوور دەبێ.

گوێم لە دەنگی ڕدێن خورماییەکەیانە:

– ئەو دیســان دەگــەڕێتــەوە. ڕووت و قــووت بەدارەوە هەڵواسـراو، ڕووت و قووت دەگەڕێتەوە.

باپیرم پێ دەکەنێ، دەڵێ:

– ئەم بیر و بڕوایەی ئێوە لە بیر و بڕوای مەسیحییەکان دەچێت. ئەوانیش دەڵێن عـیـسـا پێـغـەمـبـەر دووبارە دەگـەڕێتـەوە سـەر دنیـا. نـەک هـەر ئەوان، مـوسڵـمانی وا هەن، ئەوانیش بیر و بڕوایان وایە کە عیسا پێغەمبەر، ڕۆژێ دێ، لە شامی شەریف بەدیار دەکەوێ.

ئەو، یـەکـســـەر وەڵامی قـســـەکـانی بـاپیـرم ناداتەوە. بـەدەست و پەنجـــە

ئەستوورەکانی چۆکی دەگرێ، خۆی کۆ دەکاتەوە. وا بە تەواوی لەشی کەوتووەتە ناو ئاڵقە ڕووناکییەکەوە. لەلارا چاوم لەدەموچاویەتی. کەپوویەکی گەورە و ڕێک و ڕاستی هەیە. وەک لە گژ مرۆ ڕاچێ وای قسە دەکرد:

– دەڵێن، عیسا پێغەمبەر بە گۆشت و هێسک و پرووسک و ڕدێنەکەی خۆیەوە زیندوو دەبێتەوە. بەڵام بەدرەدینی ئێمە بێ هێسک و پرووسک و بێ ڕدێن و بێ سمێڵ، وەک نیگای چاوان، وەک قسەی زمانان، وەک هەناسەی سینگان زیندوو دەبێتەوە. دەڵێ ئەمە دەزانم... ئێمە بەندەی بەدرەدینین. کە دەڵێن بەدرەدین زیندوو دەبێتەوە، مەبەستمان ئەوەیە کە قسە و نیگا و هەناسەکەی لە ناو ئێمەدا زیندوو دەبێتەوە.

بێدەنگ بوو. لە شوێنەکەی خۆی هێورییەوە. جا باپیرم بە زیندووبوونەوەی بەدرەدین بڕوای هێنا یا نەهێنا، ئەوە نازانم. بەڵام من خۆم لە تەمەنی نۆساڵیمدا بڕوام بەمە هێنا. ئێستاش وا تەمەنم سی و ئەوەندە ساڵەیە هەر بڕوام وایە.

نەخشەکانی ناو ئەم کتێبە بەپەڕی هونەرمەندی کورد عابدین دینۆ دروست کراون و لە چاپە تورکییەکەی سەرجەمی بەرهەمی شاعیر وەرگیراون، کە لە بوڵغاریا لەچاپ دراوە.